كِتَابُ

# شَرْحُ السُّنَّةِ

لِإِمَامِ المُزَنِيِّ

بــەكــوردی

وەرگێڕانی

هاوکار کوردی

## هـۆکـاری نـوسـینـی کـتـێـبـی(شـرح الـسـنـة)

علي بن عبدالله الحلواني دەڵێت:ـــ لە طرابلس لەوڵاتی مەغریب بووم من و هاوڕێکانم باسی سونەتمان دەکرد لەناو ئەو باسە باسی (المزني)ـیمان کرد .هەندێک لەهاوڕێیانمان لەوکەسانەی کە لەمەجلیسەکە دانیشتبوون وتیان:ـ پێمان گەیشتووە(المزني)لەبارەی قورئانەوە قسە دەکات وە ئەوەستێت لەبارەی قورئانەوە واتە لە(الواقفية)ییەکانە کە نەدەیان وت قورئان مەخلوقە نە مەخلوق نیە .کەسێکیش لەناو مەجلیسەکە بوو ئەوەی پشت ڕاستکردەوە کە بەڵێ (المزني) وادەڵێت . تا ئەوەی کۆمەڵێکی تر لەخەڵک کۆبوونەوە ئیتر خەڵک بەم باسە زۆر خەفەتیان خوارد ئەوەبوو نامەیەکیان بۆ نووسی بۆ ئەوەی هەواڵی ڕاست ببیستن(الإمام المزني) ئەویش(شرح السنة)ـــی بۆیان نووسی کەدەربارەی : قەدەر و ئیرجاء و قورئان و ڕۆژی زیندووبونەوە و کاتی وەرگرتنی نامەی کردەوەکان و تەرازوو و باسەکانی ئەقڵ تێدا نووسی:ـــ

بـــسـم الله الــرحــمــن الــرحــيــم

الله تعالی ئێمه و ئێوەش بپارێزێت ، وه ئێمه و ئێوەش تەوفیق بدات بۆ ڕێنموویی خۆی لەپاشاندا:

تۆ الله چاکت بکات پرسیارت لێکردووم بۆ ئەوەی شتانێک لەعەقیدەی ئەهلی سوننەت بۆ ڕوون بکەمەوه ، بۆئەوەی وات لێبکات ئارام بگری لەسەر دەست گرتن پێیەوه، وه بۆ ئەوەی خۆت دوور بخەیتەوه لەگومانی قسه و قسەڵۆک(قیل و قال) وەخۆت دوور بخەیتەوه لەمەیل چوونت ، بۆلادانی گومڕاکاران منیش عەقیده و مەنهەجێکت بۆ ڕاڤه دەکەم که کەمتەرخەمیم نەکردووه لەوەی کەخۆم و ئێوەش ئامۆژگاری بکەم .

دەست پێکم تێدا:ـــ سوپاس و ستایشی الله تعالی یه که خاوەنی هیدایەت و تەوفیق بوونی بەندەیه.سوپاس و ستایش بۆ الله تعالی که هەر ئەو شایستەتره بەوەی یادی بکرێت .وه لەپێشتره بۆ ئەوەی سوپاسی بکرێت ، هەرچی مەدح و پێداهەڵدانه بۆ سەر ئەوه.

١ــ الله تعالی تاکە و جێگای نیازە، نەهاوسەر وە نەهیچ منداڵێکی هەیە ، بەرزترە لەوەی نموونەی هەبێت، نەهیچ هاوتا و هاوشانێکی هەیە ، بیسەر و بینەرە ، خاوەن زانست و لێزانە، پارێزەر و بەرزە.

٢ــ بەزاتی خۆی لەسەر عەرشە،وە بەزانستی نزیکە لەبەندەکانی.

٣ــ زانستی الله تعالی دەوری هەموو شتێکی داوە، ئەو شتەی پێش وەختە لەقەدەری مرۆڤەکانی نووسیوە لەناو مەخلوقاتیدا جێبەجێی کردووە، الله تعالی ئەفەرموێت(يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ) غافر: 19 واتە:ـــالله تعالی زانایە بەخیانەتی چاو ئەوەشی لەسینەدا شاردراوەتەوە.

دروستکراوەکان کار دەکەن بەپێش وەختەی زانستی الله تعالی ، وە ئەوەی بۆی درووست بوون لە(خیر و شر) بەندەکان خەریکی جێبەجێ کردنن، وە بەندەکان بە طاعەت کردن ناتوانن هیچ سودێک بەخۆیان بگەیەنن .وەهەروەها ناتوانن خراپەکان لەخۆیان دووربخەنەوە .الله تعالی بەندەکانی درووستکردووە بەویستی خۆی بێ ئەوەی پێویستی پێی هەبن.

٤ــ الله تعالی گشت فریشتەکانی خۆی بۆ طاعەتی خۆی درووست کردووە .وە ڕایهێناون لەسەر عیبادەتی خۆی تێیدا فریشتەی هەڵگری عەرشن بەدەسەلاتی خۆی، وەکۆمەڵێکی تری لەدەوری

عەرشدا تەسبیحاتی الله تعالی دەکەن وەهەندێکی تری بەسوپاس کردنی بەرزی ڕادەگرن، وە هەندێکی تری هەڵبژاردووە وەک نێردراو بۆ لای پێغەمبەران وەهەندێکی تری فەرمانەکانی الله تعالی بەڕێوە دەبەن بەفەرمانی خۆی.

٥ــ لەپاشاندا ئادەمی بەدەستەکانی خۆی درووست کرد وەلەبەهەشتەکەی خۆی دانیشتاندن .وە پێش ئەوە بۆ زەوی درووستی کردبوون وە نەهی لێکردن کەلەو دارە بخۆن کە بەخواردنی بڕیاری لەسەر دابوون پێش وەختە کە جێبەجێی کرد . لەپاشاندا تاقی کردنەوە بەوشتەی کە نەهی لێکردبوون لەخواردنی، لەپاشاندا دوژمنەکەی کە ئیبلیسە بەسەریانەوە زاڵ کردبوون ئەویش گومڕایی کردن .

ئیتر بەخواردنی ئەم دارە بوو بەهۆکار بۆ ئەوەی بێنە سەر زەوی . هیچ ڕێگایەک لەبەردەم نەبوو کە ئەم دارە تەرک بکات و نەیخوات، وەهیچ ڕێسایەک نەبوو کە بیگرنەبەر.

٦ــ لەپاشاندا الله تعالی لەوەچەی ئادەم خەڵکانێکی درووست کرد بۆ بەهەشت، درووستکراوەکانیش لەبەهەشتیەکان لەژێر ویستی الله تعالی کاریان بۆ چوونە بەهەشت دەکرد وە بەدەسەڵات و ویستی خۆی بەندەکان جێبەجێیان دەکرد.

وه الله تعالی لەوەچەی ئادەم خەڵکانێکی درووست کرد بۆ دۆزەخ . وه چاوی درووستکراوانێکی درووست کرد کە پێیان نەدەبینی، وه گوێچکانێکی لەدرووستکراوەکانی درووست کرد کە پێیان نەدەبیست، وەدڵانێکی درووست کرد کە تێنەدەگەیشتن،ئەوانە لەم ڕێگای هیدایەتە دوورخرابوونەوە وه بەکردەوەی دۆزەخ کاریان دەکرد بەهەبوونی زانستی پێشت وەختەی الله تعالی.

٧ــ ئیمان بریتییه لە: ــ وته و کردەوە هەردووکیان(وته و کردەوە)یەکسانن و یەکتری تەواو دەکەن و هاوتان جیاوازی نیه لەنێوانیاندا .ئیمان بوونی نیه بەبێ کردەوە وه کردەوەش بێ ئیمان. ئیمانداران جۆراوجۆرن لەئیماندا، وەبەکردەوەی چاکیان ئیمانیان زیاد دەکات، بەکردنی تاوان لە ئیمان دەرناچن وەبەکردنی تاوانی گەورە و سەرپێچی کردن تەکفیر ناکرێن وەشایەتی نادەین لەسەر هیچ کەس بەبەهەشت و دۆزەخ ئیلا پاش ئەوەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم شایەتی بەبەهەشت و دۆزەخ لەسەر کەسانێکی داون.

٨ــ قورئان کەلامی الله تعالی یە لەوەوە بۆ خەڵک دابەزیوە وەمەخلوق نیه تا لەناوبچێت.

٩ــ وته وده سه لاتی و سیفەتی الله تعالی کاملن و مەخلوق نین، بۆ ئەبەدی دەبێت وەبەردەوامیش لەڕابردوودا هەبووە تازە نین

کەلەناو بچن، وە پەروەردگاری ئێمەش کەم و کوڕی نەبووە تا بۆی زیاد بکەین.

سیفاتی الله تعالی بەرزترە لەوەی بە سیفاتی مەخلوقاتی بچێت، وە وەسفکارانی زیرە کـــ کەمتەرخەمن لەوەسفکردنیدا نزیکە بۆ وەلامدانەوەی ئەو کەسەی داوای لێدەکات دوورە لەمەخلوقاتی بەدەسەلاتی خۆی، وەکەس ناتوانێ دەستی بە الله بگات و زیانی لێ بدات، بەزاتی خۆی لەسەر عەرشەکەیەتی، وە جیایە لەمەخلوقاتی، هەیە و نەبوو و ون نیە.

١٠ــ درووستکراوەکانی دەمرن بەو کات و ئەجەلەی کە بۆی داناون لای کۆتایی پێ هاتنی ڕزقیان وە پچڕانی شوێنەواریان .

١١ــ لەپاش مردنیان لە گۆڕەکانیان گوشار **( الضغطة )** دەدرێن و پرسیاریان لێدەکرێت.

١٢ــ پاش ئەوەی لەگۆڕەکانیان دەڕزێن دووبارە زیندوو دەکرێنەوە وە لەڕۆژی قیامەت بۆ لای الله تعالی کۆدەکرێنەوە، وە چاکە و خراپەکانیان لەبەردەم الله تعالی نیشان دەدرێن و لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت بەئامادەیی تەرازووەکان بۆ کێشانی کردەوەکانیان، وە نامەی کردەوەکان بڵاو دەکرێنەوە کە تێدا هەموو شتێک تۆمار کراوە بەڵام ئەوان لەبیریان چووە(فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ

سَنَةٍ)المعارج:4 واتە:ــ لەڕۆژێک کە ئەندازەی ڕۆژەکە پەنجا هەزار ساڵە،ئەگەر بێتو غەیری الله تعالی دادوەر بوایە بەڵام الله تعالی بەدادپەروەری خۆی حوکمیان لەنێوان دەدا بەئەندازەی نیوەی ڕۆژێک لەدونیا (وە لەڕیوایەت هاتووە:ــ ئەندازەکەی نێوان نیوەڕۆ تا عەسرە)

الله تعالی ئەفەرموێت (وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ )الأنعام:62 واتە:ــ ئەو زاتە خێراو لەماوەیەکی کەمدا لە هەمووان دەپرسێتەوە وەک چۆن لەسەرەتاوە لەناو سکی دایکیاندا بەدبەخت و سەرفرازیان دیاریکرا لەم ڕۆژی قیامەت بەهەمان کۆتایی بەدبەخت بوون و سەرفراز بوون دەگەڕێنەوە، الله تعالی ئەفەرموێت(فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ )الشوری:7 واتە:ــ ئەو ڕۆژە خەڵکی دەبنە دوو بەشەوەدەستەیەکیان بۆ بەهە شت بەڕێ دەکرێن و دەچنە ناو بەهەشتەوە، دەستەکەی تریان بۆ ناو دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێت.

١٣ــ بەهەشتیەکان لەو ڕۆژەدا لەبەهەشت خۆش دەگوزەرێنن، وە بەجۆرەهای چێژەکان چێژ وەردەگرن، وە بەگەورەترین ڕێزگرتن دڵخۆش دەبن.

١٤ــ بەهەشتیەکان لەو ڕۆژەدا پەروەردگارەکەیان دەبینن هیچ لاوازیەک و گومانێک نابینن لەبینینی الله تعالی بەچاوی سەریان،

لەو ڕۆژەدا دەم و چاوانێک هەن گەش دەبنەوە بەو ڕێزەی لێیان گیراوە لەبینینی الله تعالی، وە چاوانێک فەزڵ وەردەگرن بەبینینی، بەهەشتیەکان لەبەخششی بەردەوام نیشتەجێن. الله تعالی ئەفەرموێت (لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُمْ مِنْهَا بِمُخْرَجِينَ )الحجر:48 واتە:ــ هیچ جۆرە بێ تاقەتی و بێزاری و ناخۆشی و پەستیەک دووچاریان نابێت و هیچ کات ئەوان لەو بەهەشتە دەرناکرێن.هەروەها دەفەرموێت (أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوْا وَعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ )الرعد:35 واتە:ــ خواردن و خواردنەوە هەمەجۆر و هەمەڕەنگی بەردەوامە هاوڕێ لەگەڵ سێبەری خۆش و هەوای سازگارو شنەی شەماڵدا ئەوەیە سەر ئەنجامی ئەوانەی لەتوڕەیی خوا خۆیان پاراست، سەر ئەنجامی بێ باوەڕو خوانەناسانیش ئاگری دۆزەخە.

وە ئینکاری کاران لەحەق لەم ڕۆژەدا لە پەروەردگاریان مەمنوع دەکرێن وە لەئاگری دۆزەخدا دەسوتێنرێن، .الله تعالی ئەفەرموێت (لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنْفُسُهُمْ أَنْ سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ )المائدة:80 واتە:ــ سوێند بە خوا دەست پێشکەرییەکی خراپیان بۆ خۆیان ئەنجامداوە کە خوایان لە خۆیان تووڕە کردووە بەو کارەیان )لە قیامەتیشدا لەناو سزای دۆزەخدا دەبێت بۆ هەمیشە بمێننەوە.

وه دهفهرموێت (لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ )فاطر : 36 واته:ــ بڕیاری لهناو چوونیان نادرێت، تا بمرن و ڕزگاریان ببێت !!تهنانهت بهشێک له سزاکهش لهسهریان کهم ناکرێتهوه، ئا بهو شێوهیه ههموو کافرو بێ باوهڕه سهرسهختهکان سزا دهدرێن و تۆڵهیان لێ دهستێنین.

جگه لهو موحیده تاوانکارانه نهبێت که بهویستی الله تعالی دهریان دێنن.

١٥ــ وه گوێڕایهڵی وهلی ئهمرهکان تا ئهوکاتهی لهژێر ڕهزامهندی الله تعالی دان، دوورکهوتنهوه لێیان لهوهی که الله تعالی لێیان توڕهیه، وه وازهێنان لهدهرچوون لێی لهکاتی سنوور بهزاندن و خراپهکاری، وهلهسهر خهڵکهکهشه که بگهڕێنهوه بۆ لای الله تعالی و تهوبه بکهن.

١٦ــ دهست ههڵگرتن لهتهکفیری ئههلی قیبله، وهدهست ههڵگرتن لهخۆ بهریکردن لێیان بهبیانووی ئهوهی تاوانیان ئهنجامداوه مادام بیدعهیهکی گومڕاکهری ئهنجام نهداوه(بدعة مكفرة) ههرکاتێک ئهم بیدعه گومڕاکهرهی ئهنجامدا ئهوکات لهئههلی قیبله دهردهچێت و لهدین دهردهچێت وه ئهوکات خۆتان نزیک بکهنهوه له الله تعالی بهخۆبهریکردن لێی، وهههجری بکهن و سووکی بکهن، وه

دووربکەونەوە لەبیدعەکەی چونکە بیدعەکەی ئەوەندە ترسناکە وەک نەخۆشی گورێتی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوازرێتەوە.

١٧ــ وە ئەهلی سوننە دەربارەی فەزڵی جێنشینی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم أبي بكر الصديق (رضي الله عنه) دەفەرموون: ــ خاوەن فەزڵترین مەخلوقە لەدوای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وە چاکترینە دوای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، دووەم کەس لەدوای أبي بكر الصديق(رضي الله عنه) فاروقە ئەویش : عمر بن الخطاب (رضي الله عنه)کەئەم دووانە وەزیری پێغەمبەرن صلى الله عليه وسلمەوە ڕاکشاون لای گۆرەکەی.
وە سێیەم کە خاوەن دوو نورەکەیە کە عثمان بن عفان(رضي الله عنه)ــە لەپاشاندا خاوەن فەزڵ و تەقوا علي بن أبي طالب ــ رضي الله عنهم اجمعين ــ.

لەپاشان ئەوەی ماوە لەدە کەسە موژدە دەرەکە( کە بریتین لە:ــ طلحة و زبير بن الجراح، سعد وسعيد و عبدالرحمن بن عوف ــ رضي الله عنهم اجمعين ــ)ئەوکەسانەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم شایەتی بەهەشتی بۆ داون هەرپیاوێک لەوان خاوەن فەزڵن بەئەندازەی ئەو خۆشەویستیەی کە بۆتە مایەی شایەتی دانی

پێغەمبەر ﷺ بۆیان .لەپاشاندا گشت هاوەڵانەی ئەوانەی لەدوای ئەوانەوە هاتوون ــ رضي الله عنهم اجمعين ــ .تەنها باسی فەزڵیان دەکەین، وە کردەوە چاکەکانیان باس دەکەین، وە دەست هەڵدەگرین لەقسەکردن لەوەی دار هێنراوە بەنێوانیاندا، ئەوانە باشترین خەڵکی سەر زەوین پاشی پێغەمبەرەکەیان ﷺ، الله تعالى لێیان ڕازی بوو بەوەی ببنە شوێنکەوتەی پێغەمبەر ﷺ وکردنی بەسەرخەری دینەکەی، وەئەوانە گەورەیی دینن، وە گەورەی مسوڵمانانن ــ رضي الله عنهم اجمعين ــ.

١٨ــ وە تەرکی ئامادەبوونمان ناکەین لەجومعەدا، وە بەردەوام نوێژ لەگەڵ هەموو دەسەڵاتدارێکی چاک و خراپەکار دەکەین، تا ئەوکاتەی بەریئە لە بیدعەی(مكفرة) هەرکاتێ بیدعەی (مكفرة)ــی ئەنجامدا نوێژی لەپشت ناکرێت، وە بەردەوام جیهادیش دەکرێ لەگەڵ هەموو ئیمامێکی دادپەروەر یان ستەمکار، وە حەجیش بەهەمان شێوە.

١٩ــ وە لەسوننەتە :کورت کردنەوەی نوێژە (چوارینەکان) لەسەفەرەکاندا، وەهەڵبژاردنیش تێدا لەنێوان بەڕۆژوو بوون و

شکاندنی لەسەفەرەکاندا ویستت هەبوو بەڕۆژووبە ویستت نەبوو بیشکێنە.

کـــــۆتـــــایـــــــی:

٢٠ــ ئەم وتە عەقیدەییانە و کردەوانە کەباسمان کرد گشت زانایانی ڕێگای هیدایەتی سەلەفی سەرەتای ڕۆیشتوو لەسەری کۆبوونەتەوە، وەبەتەوفیقی الله تعالی تابعی دەستیان پێوە گرتووە کردوویانە بەپێشەنگ و ڕازی بوونە پێی وەدوورکەوتنەوە لەزۆر لەخۆکردن ئەوەی لەسوونەت بۆیان جێمابوو بەسیان بوو.

سەرئەنجام سەرکەوتوو بوون بەیارمەتی الله تعالی وە تەوفیق بوون، نامانەوێت لەشوێنکەوتنی قورئان و سونەت کەمتەرخەم بین، وە زیاتر لەوەی کە لە قورئان و سونەت هاتووە تێناپەڕین، ئێمە متمانەمان بە الله تعالی هەیە وە تەنها پشت بەو دەبەستین، وە حەز بەشوێنکەوتنی شوێنەواریان یین .

٢١ــ ئەوە(شرح السنة)ـە ئەوەی کەویستم بۆتانی کەشف بکەم، وە ڕوون بکەمەوە هەرکەسێک الله تعالی تەوفیقی دا بۆ هەستان

بەجێبەجێ کردنی ئەوەی بۆم ڕوونکردنەوە لەگەڵ یارمەتی الله تعالی هەستان بەجێبەجێ کردنی فەرزەکانی وەک احتیاط لەپیسیەکان ، وەدەست نوێژێکی جوان و پاک لەسەر طاعەتی الله تعالی، وە جێبەجێ کردنی نوێژەکان لەسەر توانایی، وە دانی زەکات لەسەر دەوڵەمەندەکان، وە حەج کردن لەسەر ئەوکەسانەی کەدەوڵەمەندن و خاوەن توانان، وەڕۆژوو گرتن مانگی ڕەمەزان بۆ خاوەن تەندرووستیەکان، وە پێنج نوێژ کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تەشریعی کردوون ئەوانیش بریتین لە:ـــ

١ـــ نوێژی وتر لەهەموو شەوێک.

٢ـــ وە دوو ڕکعات نوێژ پێش نوێژی بەیانی.

٣ـــ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان.

٤ـــ نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران ئەگەر ڕوویاندا.

٥ـــ نوێژی بارانە هەرکاتێ کە پێویست بوو.

٢٢ـــ وە دوورکەوتنەوە لەحەرامکراوەکان، وەخۆپاراستن لەقسە هێنان و بردن و درۆکردن و غەیبەت و دەست درێژی کردن بەناحەق، وە شتانێک بڵێیت لەسەر الله تعالی وە کە زانستت پێی نەبێت، هەموو ئەوانە لەتاوانە گەورەکان و حەڕامکراوەکانن.

وه وردبوونەوه لەکار و کاسبی و خواردنەکان و حەڕامکراوەکان و خواردنەوەکان و جل و بەرگەکان دوورکەوتنەوه لەشەهەوات چونکە هۆکارن بۆ ئەنجامدانی حەڕامکراوەکان، هەرکەسێک مەڕەکانی بلەوەڕێنێ لەدەوری شوێنێکی پارێزراو و مەمنوع نزیکە لەوەی تێ بکەوێت.

هەرکەسێک الله تعالی ئەمەی بۆ ئاسان بکات ئەوەلەدینەکەیدا لەسەر ڕێگای هیدایەتە، وە لەسەر ئومێدە بۆ ڕەحمی پەروەردگار .

الله تعالی ئێمە و ئێوەش تەوفیق بدات بۆ ڕێگە چاکترینەکەی، بەمنەتی فراوانی بەردەوامی وە گەورەیی زاتی بەرزی بەڕێزی.

سڵاو بێت لەسەر ئەوکەسانەی سڵاومان لێ دەکەن، وە گومڕاکان هەرگیز سڵاوی الله تعالی یان بۆ نییە

سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

تەواو بووم لەنوسینی ئەو ڕیسالەیە بەسوپاس و منەتی الله تعالی.

**وصلواته على محمد واله وأصحابه وأزواجه الطاهرات وسلم كثيرا كثيرا**

تەواو بووم لە وەرگێڕانی لە:

١٤٤٢/٦/١٦

٢٠٢١/١/٢٩

شەوی هەینی لەسەر شەممە(شەوی باران)

بــراتـــان

هـــــاوكـار كـوردی